# وەسیەتە پڕ حیکمەتەکانی

# لوقمانی حەکیم

# بۆ کوڕەکەی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

ئامادەکردنی
سلام علی شیخانی

التفسير

چاپی
دووەم



**له وەسیەتە پر حیکمەتەکانی**

**لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی**

# له وەسیەتە پر حیکمەتەکانی
# لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی

ئامادەکردنی

سلام علی شیخانی

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ
**نوسینگەی تەفسیر**

نــــــاوی نامیلکـــــــە: لە وەسیەتە پر حیکمەتـەکانی لوقمـانی حەکیم بۆ کوڕەکەی
ئامـــــــــادەکردنی: سلام علی شیخانی
چـاپ و بڵاوکردنــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
دیزاینـــــی نـــاوەوە : جمعە صدیق کاکە
خــــــــــــەت: نــەوزاد کۆیـــی
بـــــــــــەرگ : ئەمیـن مخـلـص
نـــۆرە و ســـاڵی چـــاپ: دووەم ١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز
تـــــــــــــیراژ: ٥٠٠٠ دانــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٨١٥ ) ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٦٠ ٤ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٢٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

**پێشکەشە**

**بە دایك و باوکی ئازیزم**

**بە هەموو ئەو دایك و باوکانەی کە دەیانەوێت ڕۆڵەکانیان بە چاکترین شێوە پەروەردە بکەن .**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

هـیچ گومـان لـەوەدا نیـە، کـە خـودای مـەزن بـۆ هـەموو چـین و توێـژێك پەیامبـەری بـۆ ناردوونـە، ئەوانیش بە چاکترین شێوە پەیامەکـەیان گەیانـدوە بە خەڵك، ئەمجا بـە هۆی ڕەوشـتە بـەرز و، وتـە پـڕ حیکمەتـەکانیان، کەسانێکیان پـەروەردە کـردوە، کـە ناویان لـە مێـژوو بـەرز و شـکاوەیە، جـا یـەکێك لـەم کەسانەی کە ناوی لە مێژوودا تۆمار کراوە، ووتە پـڕ حیکمەتەکانی وەك چـرا وان بـۆ ڕوونـاك کردنـەوەی

ژیــان (لوقمــان)ی حەکیمــە، کــە پــەروەردگار لــە قورئانی پیرۆزیشدا باسی کردوە کە چۆن ئامۆژگاری کوڕەکەی کـردوە و ڕێگـای ڕاسـت و دروسـتی پێشـان داوە.

سلام علی شێخانی ٢٠١٠/٣/٢١

# کورتەیەك لە ژیانی (لوقمان)ی حەکیم

ناوی تەواوی (لوقمان)ی کوڕی (عنقا)یە لە گەورە پیاوەکانی نەوەی (قین بن حر) بووە، هەندێك کەس دەڵێن کە (لوقمان) پێغەمبەر بووە، هەندێکی تریش دەڵێن کە پیاو چاك بووە.

بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن، کە (لوقمان) پیاو چاك بووە[1].

(لوقمان)ی حەکیم لە زەمانی (داود) (عليه السلام) بووەو، ژیاوە، پیاوێکی ڕەش تاڵە بووە، بۆیە بۆتە بەندەی پیاوێکی (بني اسرائیل) بەڵام پاشان بەهۆی حیکمەت و دانابیەکەی خاوەنەکەی ئازادی کردوە و پارەشی پێداوە.

_ دەگێڕنەوە کە (لوقمان) داناترین کەس بووە

---

[1] المعارف - ابن قتيبة- ل٥.

لە زەمـانی خۆیـدا، بـەهۆی قسـە پـڕ حیکمـەت و بـە پەندەکانی[٢].

سەرچـــاوە مێژوویـیـــەکان دەری دەخـــەن، کـــە (لوقمـان)ی حـەکیم لـە بنەڕەتـدا خـەڵکی میسـرە، هەندێکی تر دەڵێن خەڵکی حەبەشەیە.

_ (لوقمان)ی حەکیم بە داناترین کەسـی عـەرەب دەژمێردرێت پێش سەردەمی ئیسلام.

_ دەگێڕنەوە کە لوقمانی حەکیم لە کۆتاییەکانی ژیانیـدا، خـۆی دوورە پـەرێز گرتـووە لـە خـەڵك و خراپەکاریـەکانیان، چـووە بـۆ شـوێنێك لـە نێـوان (رملة) و (بیت المقدس) لەوێدا ماوەتەوە، بـۆ ئـەوەی تێکەڵی خەڵك نەبێت، جا لەوێ ماوەتەوە تاوەکو بـە خزمەتی پەروەردگاری گەیشتووە[٣].

---

[٢] النور المبين في قصص الانبياء والمرسلين - سيد نعمة الله - ل٣٧٢.
[٣] مُختار الحكم و محاسن الكلم _ ابو الوفاء المبشرين - ل٢٧٢.

# له ئامۆژگاریه پڕ حیکمەتانەی لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە

پەروەردگار دەفەرموێت: ( وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ) (لقمان: ١٣)

"لوقمان بە کوڕەکەی خۆی ووت کاتێك کە ئامۆژگاری دەکرد: کوڕە شیرینەکەم ! نەکەیت شتێك بە هاوتا و هاوبەشی خوا بڕیار بدەی، چونکە هاوبەشی دانان ستەمێکی گەورمیە"

پەروەردگار دەفەرموێت: ( يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ

مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ) (لقمان:١٦)

"ئەی کوڕی ئازیزم بە ڕاستی ئەگەر گوناهێك بە قەدەر خەرتەلەیەك هەبێت لە ناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان یاخود لە زەوی حەشار درا بێت (لای خودا شاراوە نیە) دەیهێنێتە مەیدان، چونکە خودا هیچ شتێکی لێ شاراوە نیە و زۆریش بەئاگایە".

پەروەردگار دەفەرموێت: ( يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ) (لقمان: ١٧)

"کوڕی شیرینم نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە، فرمان بە چاکە بکە و قەدەغە لە گوناه بکە، بە ئارام بە لەگەڵ ئەو ناخۆشیانەی ڕووبەڕووت

دەبنــەوە، بــە ڕاســتی ئەوانــەی باســکرا هەنــدێك لەوانەی کە هەر دەبێت ببێت".

پەروەردگار دەفەرموێت: ( وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ) (لقمان: ١٨)

"هـەروەها ڕووت وەرمـەگێڕە لـە خـەڵکی، بەسـەر زەویـدا بـە فیـز و نـاز مـەڕۆ، بـە ڕاسـتی خـوا ئـەو کەسـانەی خـۆش ناوێـت کـە خـۆ هـەڵکێش و فـەخر فرۆش و فیزاوین".

"هەوڵبدە لە ڕۆیشتندا مام ناوەنـدی بـڕۆ، بـەرەو ئامـانجێکی چاك هـەنگاو بنـێ، بـە دەنگـی هێـواش و لەبار گفتوگۆ بکە و بدوێ، چونکە بـە ڕاسـتی بێـزار تــرین و ناخۆشــترینی دەنگــەکان دەنگــی گــوێ درێژەکانە".

# له ئامۆژگاریه پڕ حیکمەتەکانی بۆ کوڕەکەی

دەگێڕنـەوە، کـە لوقمـانی حـەکیم، چوار شـتی لـە حیکمەتـەکانی هەڵبـژاردوە و، ئامۆژگـاری کوڕەکـەی پـێ کـردوە، کـە دوویـان وەبـیرە خـۆی بهێنێتـەوە و، دوویان لەبیر بکات.

ئـەو دوو شـتەی کـە وەسـیەتی پـێ کـردووە، کـە وەبیری خۆی بهێنێتەوە بریتین لە:

١-گوناهەکان ٢- مردن

- وە ئەو دوو شتەی کـە وەسـیەتی پـێ کـردوە کـە لەبیری خۆی بباتەوە بریتین لە:

١- چاکە کردن بەرامبەر خەڵك.

٢- لـــەبیر کردنـــی خراپەکاریـــەکانی خـــەڵك

بەرامبەری.

* کوڕەکەم وەسیەتت پێ دەکەم، کە دوو شت هەیە دەستی پێوە بگرە ئەوانیش:

١- سامانت بۆ بژێوی ژیانت.

٢- وە ئاینەکەت بۆ ڕۆژی دوایت.

* کوڕە شیرینەکەم ! با چەك و تفاقت بەرامبەر دوژمنەکەت لێبوردنت بێت بۆی، خۆت بە ترسنۆك پیشان مەدە لە بەرامبەری نەوەك بەسەرتدا زاڵ بێت...کوڕەکەم من ئاسن و بەردی زۆر گەورە و، زۆر شتی قورسم هەڵگرتووە، ... بەڵام هیچ شتێکم لە لا قورستر و گرانتر نەبووە، وەکو دراوسێی خراپ، من هەموو تاڵی و ناخۆشیەکم چەژتوە، بەڵام هیچ تاڵیو ناخۆشیەکم نەچەژتووە، وەکو هەژاری و نەداری بێت، کوڕەکەم با هەزار دۆستت هەبێت،

بەلام با یەك دوژمنت نەبێت، چونکە ئەگەر یەکیشت هەبێت هەر زۆرە.

* کوڕە شیرینەکەم! لە کاتی هەژاریدا پشت بە دەستکەوت و قازانجی حەلاڵ ببەستە، چونکە هەر کەسێك تووشی هەژاری و نەداری بێت، ئەوە سێ کەم و کوڕی تووش دەبێت:

١- لە ڕووی ئاینەوە لاواز دەبێت.

٢- عەقڵ و ژیری بێ هێز دەبێت.

٣- جوامێری و پیاوەتی لە دەست دەدات.

لە هەمووشیان گەورەتر ئەوەیە، کە خەڵکی نەزان گاڵتەی پێ دەکەن.

کوڕە شیرینەکەم! پشتت بە دونیا مەبەستە و دڵی خۆتی پێ مەشغوڵ و سەرقاڵ مەکە، چونکە تۆ بۆ خۆشەویستنی دونیا دروست نەکراوی،

پەروەردگار دروست کردنی دونیای زۆر لا ئاسانتر بووە، لە دروستکراوەکانی تری، چونکە دونیای نەکردۆتە پاداشتی خودا پەرستان و چاکەکاران، وە نەشی کردۆتە سزا بۆ گوناهکاران، کوڕەکەم ئەم دونیایە دەریایەکی زۆر گەورەیە، کە خەڵکی زۆری تێدا لەناوچووە، جا ئەگەر تۆ بتوانی کە کەشتیەکەت بۆ ئەم دەریایە بیروباوەڕ بێت، وە پێداویست و کەرستەت بۆی، پشت بەستن و تەوەکول بێت بە پەروەردگار، زاد و زەخیرەشت تەقوا و خوداپەرستی بێت، ئەوە تۆ بە بەخشندەی پەروەردگار لەم دەریایە ڕزگارت دەبێت.

خۆ ئەگەر لەناو ئەم دەریایەش تیابچی ئەوە بەهۆی گوناهەکانی خۆتە.

کوڕەکەم گەر شتێکی سەیرت نەبینی پێمەکەنە، هەرگیز بە بێ ئەدەبی بە ڕێگادا مەڕۆ و، پرسیار لە

شتێك مەكە، كە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

كوڕەكەم! ماڵ و سامانت بە فیرۆ مەدە، ماڵ و سامانی كەس بە زۆر وەرمەگرە، چونكە ئەوەی بە دەستی دەهێنی بۆ تۆیە، ئەوەی وازی لێ ئەهێنی، بۆ غەیری تۆیە.

*كوڕە شیرینەكەم! هەر كەسێك بەزەیی بە خەڵك ،دابێتەوە، خوداش بەزەیی بەودا دێتەوە، هەر كەسێك بێ دەنگ بێت، لە هەموو كاتێك قسە نەكات، ئەوە سەلامەت دەبێت، هەر كەسێك قسەی خێر بكات، شتی زۆر بە دەست دەهێنێت، هەر كەسێك قسەی خراپ و شەڕ بكات، ئەوە تووشی گوناهی زۆر دەبێت، هەر كەسێك زمانی خۆی نەپارێزێت، ئەوە تووشی پەشیمانی و، ئاهو

حەسرەت دەبێت[4].

*دەگێڕنەوە، کە لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی فەرمووی: کوڕەکەم! چیت بە دەست هێناوە لە حیکمەت و دانایی؟

ئەویش فەرمووی: خۆم بە شتێك خەریك ناکەم، کە پەیوەندی بە منەوە نەبێت.

لوقمانی حەکیمیش فەرمووی: کوڕەکەم شتێکی ترت ماوە، ئەویش ئەوەیە، لە کۆڕ و کۆبوونەوەی زانایان دابنیشە و، پێشبرکێ بکە بۆ ئەم شوێنانە، چونکە پەروەردگار دڵە مردووەکان بە وتەی پڕ حیکمەت و دانایی زیندو دەکاتەوە، هەروەك چۆن زەوی، کاتێك کە وشك دەبێت، بەهۆی بارانی بەخوڕ سەوز دەبێت و دەژێتەوە.

---

[4] جامع بيان العلم _لابن عبدالبر (ج١- ل١٠٦).

کوڕە شیرینەکەم! فێری زانست و زانیاری مەبە، بۆ ئەوەی شانازی بە خۆت بکەی بەرامبەر بە زانایان، یاخود بۆ ئەوەت بێت کە مشت و مڕ لەگەڵ کەسێکی نەفام و نەزاندا بکەی، یاخود بۆ ئەوە بێت، کە خۆت لە ناو خەڵکدا بە دەربێخیت لە بەرامبەر ئەمەشدا دەست لە زانست هەڵمەگرە، نەوەك حەزت بچێتە نەفامی و نەزانی.

کوڕە شیرینەکەم! تەماشای کۆڕ و کۆبوونەوەکان بکە ئەگەر بینیت ئەوانەی لەم شوێنە دانیشتوون، یادی پەروەردگار دەکەن، ئەوە تۆش لە گەڵیان دانیشە، چونکە تۆ گەر زانا بیت کە لە گەڵیان دانیشتی ئەوە زانستەکەت سوودی بۆت دەبێت، خۆ ئەگەر نەفامیش بیت، ئەوە کە لە گەڵیان دادەنیشیت فێر دەبیت.

بەڵکو خوداش بە چاوی میهرەبانی سەیریان

دەكات، تۆش بەر ئەم میهرەبانی و بەخشندەیە دەكەویت. بەڵام ئەگەر بینیت خەڵكانێك دانیشتوون و یادی خودا ناكەن، تۆ لە گەڵیان دامەنیشە چونكە ئەگەر تۆ زانا بیت، ئەوە زانستەكەت سودی بۆت نابێت، ئەگەر نەفام و نەزانیش بیت، ئەوە زیاتر تووشی گومڕایی و نەفامی دەبیت.

جا نەوەك پەروەردگار، بە چاوی خەشم و تورەیی سەیریان بكات، تۆش وەبەر ئەم سزا و تورەییەی خودا بكەوی[٥].

دەمەقاڵی لەگەڵ زانایاندا مەكە، نەوەك تۆیان لە لا سووك ببێت، هەروەها دەمەقاڵی لەگەڵ كەسانی نەفام و نەزانیش مەكە، نەوەك بە نەفامت

---

[٥] جامع البيان العلم و فضله - ابن عبدالبر- (ج١ ل١٠٧).

تێبگەن‌و، قسەی ناشیرین و جنێوت پێ بدەن، بەڵکو ئارام بگرە، لەگەڵ ئەو کەسەی، کە لە تۆ بەرزترە لە ڕووی زانست و زانیاری، هەروەها لەگەڵ ئەوەش، کە لە تۆ نزمترە لە زانست و زانیاری چونکە ئەو کەسانە دەگەن بە پلەی زانایان، کە لەگەڵیان ئارام دەگرن و هەردەم لە گەڵیان دەبن، هەروەها بە نەرم‌و نیانی زانستیان لێ وەردەگرن و فێری دەبن.

کوڕە شیرینەکەم ! گەر بە سەلام کردن چوویتە لای خەڵکانێك، ئینجا لە کوچێك دانیشە و، قسە مەکە هەتا ئەوان قسە دەکەن، جا گەر یادی پەروەردگاریان کرد، تۆش لەگەڵیان یادی خودا بکەرەوە، وە ئەگەر بینیت جگە لە خودا باسی شتێکی تر دەکەن، ئەوە تۆ لەم شوێنە دامەنیشە و

بڕۆ بۆ شوێنێکی تر[٦].

کوڕە شیرینەکەم! لەگەڵ زانایان دابنیشە و، پێشبرکێیان لەگەڵ مەکە، نەوەك نەهێڵن لایان دانیشیت، پەند و عیبرەت لەم دونیایە وەربگرە، ڕۆژوێکی وەها بگرە کە لە هەموو هەوا و ئارەزووەکانی دونیا دورت بخاتەوە و ڕۆژوێك مەگرە لە نوێژ دوورت بخاتەوە، لە کاتێکدا نوێژەکە لە لای خودا لە ڕۆژووەکە خۆشەویستترە.

کوڕە شیرینەکەم! ئەگەر لە بچووکیەوە، فێری ئەدەب و ڕەوشت بەرزی ببیت، ئەوە لە کاتی گەورەییدا سوودی لێ دەبینیت.

کوڕە شیرینەکەم! لە خودا بترسە، ئەگەر بە قەدەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا چاکەت هەبێت، هەر

---

[٦] تفسیر -ابن کثیر- ج٣ ل٦٤١.

لەوە بترسە کە سزا نەدرێیت، نزا و تکا لە خودا بکە، ئەگەر نزاکانیش بەشی گوناهی هەموو ئەو کەسانە بکات، کە لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا هەن، بەڵکو هەر نزا و دوعا بکە کە خودا لێت خۆش بێت.

جا کوڕەکەی لوقمان لە باوکی پرسی:

بەڵام باوکە گیان من چۆن دەتوانم ئەم هەموو شتە بکەم، لە کاتێکدا کە من یەك دڵم هەیە؟!

لوقمانیش پێی فەرموو:

کوڕە شیرینەکەم! ئەگەر دڵی مرۆڤی بڕوادار دەربهێنرێت ئەوە دەبێتە دوو ڕۆشنایی، ڕۆشناییەك بۆ لە خودا ترسانە، ڕۆشناییەکیش بۆ نزا و دوعایە، جا ئەگەر بیان پێویت، هیچیان ناچێتە سەر ئەوی تر و پەیوەندی بەوی ترەوە نییە.

کوڕە شیرینەکەم! چاك بزانە کە لە سەرت پێویستە بەندایەتی بۆ پەروەردگار ئەنجام بدەیت و، ئارام بگریت، چاکە بزانە، کە لە ئارام گرتندا خۆشەویستی و لێبوردەیی و چاودێری هەیە، جا ئەگەر ئارام بگریت لەسەر ئەو شتانەی کە پەروەردگار لێی قەدەغە کردوی و، واز لە دونیا بهێنیت و گوێی پێ نەدەیت و، ئەو ناخۆشیانەی لەلات ئاسان بێت، کە پەروەردگار بەسەرتدا دەهێنێت، ئەوە هیچ شتێکت لە مردن لە لا خۆشەویستر نابێت، ئەمجا بە چاکی چاودێری مردنت دەکەی و کاری بۆ ئەنجام دەدەیت.

کوڕە شیرینەکەم! کاری چاکە ئەنجام بدە و، خۆت دوور بگرە لە کاری خراپە، چونکە کاری چاکە خراپە دەسڕێتەوە و لای دەبات.

کوڕە شیرینەکەم! یاد و زیکری پەروەردگار زۆر

بکـە، چـونکە خـودای گـەورەش یـادی ئـەو کەسـە دەکات، کە یادی خودا دەکات.

کـوڕە شـیرینەکەم! بـا گوناهـەکان هـەردەم لـە بەرچاوت بێت و، کارە چاکەکانت با لە دواوەت بێـت، جا لە دەست گوناهەکان ڕابکە و، بۆ لای پـەروەردگار بگەڕێوە و، کارە چاکەکانت بە زۆر مەزانە.

کوڕە شیرینەکەم! ئەگـەر کەسێکت بـینی هەڵـەی کرد، تۆ سەرزەنشتی مەکە، بەڵکو گوناه و هەڵـەکانی خۆت بە بیر خۆت بهێنەوە، چونکە تـۆ پرسـیارت لـە کار و کردەوەکانی خۆت لێ دەکرێت.

کوڕە شیرینەکەم! بـە لـەش سـاغی و تـەندروسـتی باش هەڵمەخەڵەتێ و، ناخۆشیەکانت ئاشکرا مەکە و بیشارەوە، چونکە ناخۆشـی لەگـەڵ گەنجینـەی چـاکە دایـە، بـەڵکو ئـارامی لەسـەر بگـرە، چـونکە ئەمـە لـە

دوایی دەبێتە زاد و زەخیرەت.

کوڕە شیرینەکەم! بەشتی سووك و سادە رازی بە، هەروەها بەو ڕزق و ڕۆزیە ڕازی بە، کە پێت دەبەخشرێت و، چاو مەبڕە ڕزق و ڕۆزی یەکێکی تر، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی ئازار بچێژیت.

کوڕە شیرینەکەم! لەگەڵ کەسانی زانا و دانا دابنیشە و، بە حیکمەت و دانایی قسەیان لەگەڵ بکە، تاوەکو فێری حیکمەت و دانایی ببیت.

کوڕە شیرینەکەم! بە دوای پێداویستیەکاندا بڕۆ، هەرگیز قسەیەك مەدرکێنە، کە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

کوڕە شیرینەکەم! نەرم بە لەگەڵ خەڵك و، چاکەیان لەگەڵدا بکە، زۆر بیر بکەوە و تێ بفکرە، قسە زۆر مەکە، تەنها لە کاتی وتنی ڕاستیدا نەبێت،

زۆر بگـــری و کـــەم دڵخـــۆش بـــە، گاڵتـــە مەکـــە و، مەقیژێنــە و، هـاوار مەکـە، هـەر کاتێـك بـێ دەنـگ بویـت، بـا بـێ دەنگیەکـەت بـە بـیر کردنـەوە و تـێ فکرین بێت، هەر کاتێکیش قسەت کرد، بـا قسـەکانت بە حیکمەت و دانایی بێت.

کوڕە شیرینەکەم! گەر قسەکردن وەکو زیـو بێـت، ئەوە بێ دەنگی وەکو زێـر وایـە، گـەر بێـدەنگ بیـت هەرگیز پەشیمان نابیتەوە، بەڵام لەوانەیـە زۆر جـار پەشیمان ببیتەوە، گەر قسە بکەی.

کوڕە شیرینەکەم! سـوود لـەم زانسـتە وەرگـرە، کـە خودا پـێی بەخشـیویت، چونکە زانـا هـەرگیز وەکـو نـــەفام و نـــەزان نابێـــت، چـــاکترین زانســـت، ئـــەو زانستەیە کە سوودی هەبێت و، خـەڵکیش سـوودی لێ وەربگرێـت، چـونکە خـودای گـەورە خێـر و چـاکە دەخاتـە زانسـتێك کـە سـوودی بـۆ خـەڵك هـەبێت،

زانست و زانیاری سوودی بۆ یەکێك نابێت کە وازی لێ بهێنێت.

کوڕە شیرینەکەم! زاناترینی خەڵك ئەو کەسەیە کە زۆر لە خودا دەترسێت و، دەیپەرستێت.

کوڕە شیرینەکەم! وتەی مامۆستا و زانایان وەکو سەرچاوەیە، رۆژ بە رۆژ خەڵك پێویستیان پێی دەبێت.

کوڕە شیرینەکەم! زمانت کلیلی چاکە و خراپەیە، کەواتە دەمت ببەستە، تەنها قسەی خێری پێ بکە، ئەگەر نا مۆرێکی لێ بدە، هەروەك چۆن مۆر لە زێرو زیو دەدرێت.

کوڕە شیرینەکەم! خۆشی بۆ ئەو کەسەی کە بە ژیانی دونیا هەڵنەخەڵەتاوە و، لە حەشر و حیسابی رۆژی دوایی پەشیمان نەبۆتەوە، چونکە کار و

کردەوەی بۆ ئەنجام داوە.

کوڕە شیرینەکەم! هەر کەسێك بەزەیی بە خەڵك دابێتەوە، ئەوە خوداش ڕەحمی پێدەکات، هەر کەسێك بێ دەنگ بێت و قسە نەکات، کە پەیوەندی بەو نیە، ئەوە سەلامەت دەبێت لە هەڵە کردن، هەر کەسێك کاری چاکە ئەنجام بدات، دەوڵەمەند دەبێت، هەر کەسێك قسەی ناشیرین و خراپ دەرببڕێت، ئەوە تووشی زەرەر و زیان دەبێت، هەر کەسێك ڕقی لە کاری خراپە ببێتەوە، دوور دەبێت لە کاری خراپە.

کوڕە شیرینەکەم! لە نزا و دوعای ستەم لێکراو بترسە، چونکە دوعای ستەم لێکراو لە هەموو دوعایەك خێراترە بۆ لای پەروەردگار و، لە هەموو دوعایەکیش زووتر وەڵام دەدرێتەوە و قەبووڵ دەکرێت.

کوڕە شیرینەکەم! ئامۆژگاری لە خەڵك وەرگرە، ئەگەر لەسەریشت قورس و گران بوو. هاوار بە ماڵی ئەو کەسەی کە حەز بە گومڕایی دەکات، لە بەرامبەر ڕێگای ڕاست و دروست، خۆشی و شادی بۆ ئەو کەسەی کە سوود لە زانستەکەی وەردەگرێت و، گوێ دەگرێت لە ووتەی ڕاست و دروست و دوای دەکەوێت و، کاری پێ دەکات.

کوڕە شیرینەکەم! با خەم و ئەرکی هەرە گەورەت ئەو شتە بێت کە بۆی دروست کراوی، خۆت خەریك مەکە بە شتێك کە بۆت دابین کراوە و، بەشت دەکات، گرنگی بە دونیا مەدە، چونکە سەرقاڵت دەکات و دورت دەخاتەوە لە ڕۆژی دوایی.

کوڕە شیرینەکەم! لەو کەسانە ببوورە، کە داوای لێ بوردنت لێ دەکەن، هەرگیز شانازی بە کار و کردەوەکانت مەکە، ئەگەر زۆریش بێت، چونکە تۆ

نـــازانی کـــه خـــودا ئـــەم کـــار و کردەوانـــەت لێ وەردەگرێتو قەبوڵی دەکات یان نا.

کـوڕە شـیرینەکەم! بـا گـوڵ و گـوڵزاری دونیـا هەڵتنەخەڵـــەتێنێت و، فریـــوت نـــەدات، وە دوای هەموو شتێك مەکەوە کە لە دونیا بۆت بهێنـە دی، بـەڵکو داوای ئـەو شـتانە بکـە، کـە لـە پـەروەردگار نزیکت دەکاتەوە.

کـوڕە شـیرینەکەم! هـیچ دەوڵەمەندیـەك وەکـو تەندروسـتی بـاش و لـەش سـاغی نیـە، هـیچ مـاڵ و سامانێك وەکو ژیانێکی سادە و خۆش گوزەرانی نیە.

کـوڕە شـیرینەکەم! بازرگـانی لەگـەڵ خـودا بکـە، بەوەی کە کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەی بۆی، لـە بەرامبەریدا قازانـج دەکەی.

کوڕە شیرینەکەم! هەردەم لە خودا بترسە، چونکە

ئەمە دەبێتە زاد و زەخیرە بۆت، لە کاتێکدا کە ئەم کارە لەسەرت واجبە، با هەردەم زارت بە یاد و زیکری خودا پەیوەست بێت، چونکە گەورەیی زیکری خودا لەسەر قسە وەکو گەورەیی خودایە لەسەر دروستکراوەکانی.

کوڕە شیرینەکەم! لە پەرستن و بەندایەتیکردنت بۆ خودای گەورە لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسە.

کوڕە شیرینەکەم! جێبەجێ کردنی واجبەکانت، وەکو نوێژ کردن، کە لەسەرت واجبە، گەورەترە لە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەیت، چونکە نموونەی نوێژ و زیکر کردنی خودا وەکو کەشتیە لە ناو دەریادا، ئەگەر تەواو بێت و ساغ بێت، ئەوانەی کە لە ناو کەشتیەکەن سەلامەت دەبن، خۆ ئەگەر تەواو سەلامەتیش نەبێت، ئەوە هەموویان لەناو دەچن.

کوڕە شیرینەکەم! ئەگەر بێدەن گ و لاڵ بیت باشترە بۆت، لەوەی کە قسەکەرێکی نەفام و نەزان بیت.

کوڕە شیرینەکەم! خۆت بە کەم سادە بزانە بەرامبەر ڕاستی و دروستی‌یەکانت، دەبیتە عاقڵ و ژیرترین کەس.

کوڕە شیرینەکەم! هیچ شتێك لەسەر تێری مەخۆ، چونکە ئەگەر ئەم خواردنە بۆ سەگ بەجێ بهێلیت، باشترە لەوەی کە لەسەر تێری بیخۆی.

کوڕە شیرینەکەم! بزانە کە گەورەترین نەبوونی، نەبوونی عەقڵ و ژیرییە، وە گەورەترین بەلا و ناخۆشی قەرزاریە، دیارترین کارەسات نەبوونی ئارام گرتنە، چاکترین دەوڵەمەندیش، ئەو کەسەیە کە

قەناعەتی هەیە[7].

کوڕە شیرینەکەم! هەروەك چۆن کێڵگە بە بێ ئاوو، خۆڵ دروست نابێت و گەشە ناکات، ئاوەهاش باوەڕ بە بێ کار و کردەوە و زانیاری نابێت.

کوڕە شیرینەکەم! ئەوەندە شیرین مەبە کە قووت بدرێیت، ئەوەندەش تاڵ مەبە کە فڕێ بدرێیت[8].

کوڕە شیرینەکەم! با مێروو لە تۆ عاقڵ و ژیرتر نەبێت، لە کاتێکدا ئەو زاد و زەخیرە لە هاوین کۆ دەکاتەوە بۆ وەرزی زستان[9].

کوڕە شیرینەکەم! هەرگیز تەوبە کردن دوا مەخە

---

[7] نور المقتبس _ للمرزباني _ ج1 ل127.
[8] برقيـة محمديـة في شـرح الطريقـة المحمديـة _ موقـع الاسـلام _ ج 5 ل78.
[9] آداب الأكل _ الأقفهسي _ ج1 ل8.

چونکە مردن لە ناکاو دەگاتە لات[10].

کوڕە شیرینەکەم! ئەگەر گەدەت تێر بکەی لە خواردن ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بیر و هزرت لاواز ببێت، هەروەها دەبێتە هۆی لەناوبردنی حیکمەت و دانایی و، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەندامەکانت پەکیان بکەوێت لە خودا پەرستی.

کوڕە شیرینەکەم! با تەنها کەسانی لە خودا ترس‌و، پیاو چاکان، لە خواردنی تۆ بخۆن، لە هەموو ئیش و کارێکتدا پرس و ڕا بە زانایان بکە[11].

کوڕە شیرینەکەم! مرۆڤ هەرچەندە زانا بێت زانستەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت، ئەگەر عەقڵ و

---

[10] ثمار القلوب في المضاف و المنسوب _ الثعالبي _ ل١٣٢.

[11] البداية و النهاية _ ابن كثير _ ج٢ ل١٥٢.

زیری لەگەڵدا نەبێت[12].

کوڕە شیرینەکەم! هەرگیز خۆت بە شێوەیەك بە خەڵك پیشان مەدە کە گوایە لە خودا دەترسی، لە کاتێکدا دڵت ناپاك و گوناهکارە[13].

کوڕە شیرینەکەم! ئەگەر پەروەردگار شتێك لەسەر زەوی دابنێت، ئەوە دەیپارێزێت، جا منیش ئایین و ئەمانەتی پەروەردگارت لە لا بەجێ دەهێڵم، لە منەوەش سڵاوی پەروەردگارت لەسەر بێت[14].

لە ووتە پڕ حیکمەتەکانی لوقمانی حەکیم کە لەسەرچاوەکاندا هاتووە:

لە خەڵکانی خراپە کار دوور بکەونەوە،

---

[12] التبر المسبوك في نصحية الملوك _ للغزالي _ ل٥٠.
[13] العقد الفريد _ ابن عبد ربه _ ج١ ل٣٣٤.
[14] السنن الكبرى _ للنسائي _ ج٦ ل١٣٢.

دڵـەکانتان دەسـازێت و پـاك دەبێتـەوە و، لاشـەتان دەحەسێتەوە و دەروونتان پاك دەبێت.

سوپاسگوزاری ئەو کەسە بکە، کە چاکەت لەگەڵدا دەکـات، چـاکە لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا بکـە کـە سوپاسگوزارتە، چونکە بەخشش و نیعمەت بـەردەوام نابێت، ئەگـەر بـێ بـاوەڕ بیـت، هـەرگیز بەخشش لێ نابچڕێت ئەگەر سوپاسگوزاری خودای لەسەر بکەی.

بـیر و هـزر ئاوێنـەی مرۆڤـە، چـاکە و خراپـەی پیشان دەدات.

عـەقڵ و ژیـری بـە بـێ ئـەدەب و ڕەوشـتی جوان، وەکو درەختێکی بێ بەر وایە.

چـاوپێکەوتن و بینـینی پیـاو چـاکان، ئاوەدانکردنەوەی دڵەکانە.

ئەگـەر دەتـەوێت خۆشەویسـتیت لـە دڵـی هـەر

یەکێکدا بەردەوام بێت، ئەوە ڕەوشت و مامەڵەی جوانی لەگەڵ ئەنجام بدە[١٥].

[٥] مختار الحكم و محاسن الكلم _ لأبي الوفاء المبشرين _ ل ٢٧٢ بە دواوە.